## ســــــوود و مەرجەکانی

# هاوسەرگیری

# لــە ئیســـــــلامـــــدا


ئامادەكردنی

**هیوا زیرەك**

پێداچونەوەی

**م.عدنان بارام / كەلاری**


=========================================


لەبڵاوكراوەكانی

 **ماڵپەڕی بەهەشت** 

**www.ba8.org**

 islam_kurd_ba8@yahoo.com

 07701517378

**عێراق - كوردستان - كەلار**

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

**كتێبی ژمارە ﴿٥٧﴾**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی :

الحمـــد لله رب العـــالمين ، والصلاة والسلام على رســـول الله الأمين ، وعلى آله وصحبه وسلم أجمعـــين .... أمـــا بعد :

هاوسەرگیری سیستەمێكی كۆمەڵایەتی توندوتۆڵە ، هەر لە دێری زەمانەوە هەبووە لەو ڕۆژەی كە باوكە ئادەم و دایكە حەوامان خوڵقێنراون لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ، و یەكەمین دوو هاوسەرێكن كە مێژووی مرۆڤایەتی ـ لە سەر گۆی زەوی ـ ناسیبێتیان

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ ﴾ ( البقرة : ٣٥ ) .

بەڵكو هاوسەرگیری بنەوایەكە لە بنەواكانی دروست كراوەكانی خوای پەروەردگار ، هەروەك فەرموویەتی : [ وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ ( الذاريات : ٤٩ ) .

كەواتە هاوسەرگیری قەداسەت و پیرۆزیەكی بەرز و بڵندی هەیە ، بۆیە دەبێت هەموو كۆمەڵگایەكی چاك و دروست ڕەچاوی بكات و لەسەری بڕوات .

ئـاینی ئیـسلامی پیرۆزیـش گرێبەسـتی هاوسـەرگیرێتی ، و خـودی هاوسـەرگیریەكەی لـە بـەڕێزترین گرێبەستەكان زانیوە ، ئەوەش لەبەر پەیوەست بوونی بە خودی مرۆڤەوە ، كە بەڕێزترین دروست كراوەكانی پـەروەردگارە ، چـونكە پێكـەوە گرێـدانی پیـاو و ئافرەتـە بـە پەیوەنـدی سـۆز و خۆشەویـستی و ڕەحـم بەیەكداهاتنەوە ، هەر ئەویـشە ـ واتـە : هاوسـەرگیرێتی ـ هۆكـاری خـستنەوەی وەچـە و نەوەیـەك كـە مـرۆڤ ئاواتی ئەوەی لێبكات كە بۆخوا سوڵحاو و چاكەكاربن ، هەر ئەویشە هۆكاری پاراستنی دامێن لە خراپـەكاری و بەد ڕەوشتی ... هتد .

بەواتایەكی تر هاوسەرگیری لە ئیسلامدا پێویـستیەكە لـە پێویـستیاكانی كۆمـەڵگای موسـڵمان ، چـونكە تاكـە ڕێگەی شەرعیە بۆ بەرپاكردنی كۆمەڵگای بـچوك ـ كـە خێزانـە ـ لـە سـەر بنـەوای سـۆز و خۆشەویـستی و ڕەحـم و خۆپارێزی و پاراستنی ڕەچەڵەك ، و پێشبڕكێ تیاكردنی بۆ ڕەوشت جوانی و ڕەسەنێتی ئاكارەكان .

جا ئەگەر بازاڕی هاوسەرگیری تووشی كەساسی بوو ، ئەوا ئەو كاتە داڕوخان و لێكداترازان و بێ‌نەوایی دەبێت بە بەشی ئەو كۆمەڵگایە ، ئاشوب و فیتنەیەكی گەورە لە زەمیندا بەرپا دەبێت .

جا ئەگەر هاوسەرگیریەك ئەوەندە بەرز و بڵند بێت لە ئیسلامدا و هۆكاری بەختەوەری خێزان و كۆمەڵگا بێت ، ئایا پێویستی بەلەسەر نووسینی سەدان و بگرە هەزاران پەرتوك و بڵاوكراوە نیە ؟! بۆ ئەوەی كۆمەڵگای ئیسلامی بەباشترین شێوە برەوی پێ بدرێت ، و بەرە وپێشەوە ببرێت .

**خوێنـەری خـاوەن هـزر :** ئـەم نووسـراوەی كـە لەبـەر دەسـتتدایە هاندانـە لەلایەكـەوە بـۆ دامەزرانـدن و پێكهێنانی هاوسەرگیرێتی كە زۆرێك لە لاوانـی ئێمـە بەداخـەوە ـ بـە كـوڕ و كـچەوە ـ پـشتیان تێكـردووە ! ! بەسەدەها بڕوبیانووی ناقۆڵا و بێ بنەوا ! ! !

وە لـەو لاشـەوە ـ ئـەم نووسـراوە ـ خـستنەڕوو و دەرخـستنی هەنـدێك سـود و مەرجـە لـە مەرجـەكانی هاوسەرگیرێتی بۆ ئەوەی لاوانمـان زیـاتر و زیـاتر لـە پرۆسـەی هاوسـەرگیریان ڕەچـاوی بكـەن و بگـەن بـەو ئاسوودەییەی كە لە هاوسەرگیریدا هەیە .

ئامادەكار كاكە ( **هیوا زیـرەك** ) ئـەركی ئامـادەكردن و وەرگێڕانـی خـستووەتە ئەسـتۆی خـۆی و پـێی هەستاوە ، داواكارم لە خوای پەروەردگار و میهرەبان لە ڕۆژێكدا پاداشتی من و ئەویش بداتەوە كە ﴿ يَوْمَ لَـا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ( الشعراء : ٨٨ ـــ ٨٩ )

وە داواكارم ئەمە دوا بابەت و نووسینی نەبێت ، بۆ خزمەتكردنی ئایین ، و كۆمەڵگا ، و مرۆڤایەتی ...

**وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم .**

**وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**

**باوكی سوننە**

**( عدنان بارام ) كەلاری**

## پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله تعالى من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله . صلى الله وسلم عليه وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين .

أما بعد : فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

ئێمەی موسوڵمان لە هەموو كاتێكدا لە مەیدانی جەنگداین دژ بە شەیتان و شوێنكەوتوانی چونكە لەهەر كاتێكدا بێت ئەوان هەوڵ دەدەن كوڕان و كچانی موسوڵمان لەدین هەڵبگەڕێننەوە یاخود تووشی تاوانە گەورەكانیان بكەن بۆیە ئەم جەنگەش بەدرێژایی مێژوو هەر هاتووە و پێشتر و ئێستا و لەداهاتووشدا ، ئەو ناهێڵێت بەئاسوودەیی بژین ، لەمڕۆدا ـ گەر بەوردی بڕوانینە ئەم ژیانە ـ دەبینین شەیتان لەهەموو شوێنێكدا هەیە گەر وریا نەبین ، چونكە زۆربەی ئەو ئامێرە تازە داهێنراوانە شەیتانێك سەرپەرشتی دەكات جا ئەو شەیتانە مرۆڤ بێت یاخود جنۆكە ، زۆرینەی ئامێرەكان لەمڕۆدا هەر خەریكی بڵاوكردنەوەی شتی خراپن و ئاواتیان ئەوەیە كە گەنجانمان ژن نەهێنن و كچانیشمان شوو نەكەن بەڵكو هەر خەریكی ( پەیوەندی ناشەرعی ( دڵداری ) و خۆ ڕووت كردنەوە و داوێنپیسی بن ... هتد ) بەو كارانەوە خۆیان سەرقاڵ بكەن لەبەرامبەریشدا ئێمەی موسوڵمان خوای گەورە پێمان دەفەرموێت : ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ [1] .واتە : یەكێك لە بەڵگە و نیشانەكانی خوای گەورە ئەوەیە كە هەر لە خۆتان ئافرەتی بۆ خولقاندوون بۆ ئەوەی ببن بەهۆی پشوو ئارامی بۆ پیاوان وە سۆز و بەزەییو خۆشەویستی خستۆتە نێوانتانەوە بەڕاستی لەم باسەدا چەندین نیشانەی خوای گەورەی تێدایە بۆ كەسانێك كە تێبفكرێن .

بۆیە لەم سەردەمەدا زۆر گرنگە كە كوڕان و كچانی ئیماندار زۆر بیر لە ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە بكەنەوە ، چونكە گەر هەوڵیان نەدا و بەزووترین كات هەڵنەستان بەجێبەجێكردنی ئەوا ( داوێن پیسی و بەد ڕەوشتی ) لەوە زیاتر بڵاو دەبێتەوە كە ئێستا هەیە ، وەكو ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت : ( إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فزوجوه ، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد عريض ) [2] .واتە : گەر كەسێك هاتە خوازبێنی ئەوانەی كە لە ژێر ولایەتتاندایە ، و ڕازی بوون لەدین و ڕەوشتی ئەوا ژنی پێبدەن ، ئەگەر نا ئەوا ئاشووب و خراپەی گەورە لەسەر زەویدا بڵاودەبێتەوە .

بۆیە بەپشتیوانی خوای گەورە لێرەدا بەكورتی و بەپوختی هەوڵ دەدەم باسی ( مەرج و سوودەكانی ژنهێنان و شووكردن ) و هەندێ باسی تر لەم نامیلكەیەدا بخەمە ڕوو ـ إن شاء الله ـ بە هیوای بەهەرەمەند بوونی موسڵمانان لێیان .

**ئامادەكار**

---

[1] ( سورة الروم : ٢١ ) .

[2] ( حسنه العلامة الألباني في صحيح الجامع ، برقم : ٢٧٠ ) .

## دەستپێكێك بۆ چوونە نێو باسەكە ...

هاوسـەرگیری یەكێكـە لـەو مەرجانـەی كـە بەهۆیـەوە ژیـان بـەردەوام دەبێـت ، چـونكە ژیـان هـەردەم لەسوڕاندایە و پێویستە هەر جیلێك یـاخود هـەر نەوەیـەك چـوو نەوەیـەكی كـە جێگـەی پڕبكاتـەوە ئەمـەش بەرەچـاوكردنی چـەندین مـەرج و یاسـای ژیـان ، گومـانی تێـدا نیـە خـوای گـەورە لـەو كاتـەوەی كـە ژیـانی دروستكردووە و یەكەم مرۆڤی هێناوەتە بوون كە باوكە ( ئادەمە ) (عليه السلام) ، ئیتر هاوسەری بۆ دروستكردووە كە ئەویش دایكە ( حەوا ) یە ، وەكو خوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الـَّذِي خَلَقَكُمْ مِـنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ [3] .واتە : ئەی خەڵكینە بترسن لەو خودایـەی كـەوا لـە تـەنها نەفسێك ئێـوەی خولقاندووە وە هەر لەو نەفسەش خێزانی دروستكردووە و بەدی هێناوە .

كەواتە هەر لەلاشەی باوكە ئادەم یاخود لە پەراسووی باوكە ئـادەم خـوای گـەورە دایكـە حـەوای بـەدی هێناوە ، لێرەدا شتێك هەیە پێویـستە زیـاتر ڕۆبـچین لەباسـەكەدا ئـەویش ئەوەیـە كـە خـوای گـەورە كاتێـك ئادەمی دروستكردووە لە دەروونی ئادەم شارەزا بووە بەوەی كە مـرۆڤ بەتـەنها وەكـو شـتێكە كـە بەكـەم و كوڕی ببێت . بۆیە ( پـەنا بـەخوا ) چـونكە خـوای گـەورە دانـەری هـەموو شـتەكانە و دروسـتكەری زەوی و ئاسمانەكانە و بەدی هێنەری ئەم گەردوونە لەبن نـەهاتووە و ( عالم الغيب ) ە بەهـەموو شـتەكان كـە ئێـستا ڕوو دەدەن یاخود پێشتر ڕوویان داوە و لەداهاتووشدا دێن و ڕوو دەدەن . بۆیە خوای گـەورە حـەوای بـەدی هێنا بۆ ئەوەی بتوانن بەجوانترین شێوە و خۆشبەخترین شێوە پێكەوە ژیان بەسەر ببەن وەكو دەفـەرموێت : ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَـاتٍ لِقَـوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ [4] .واتە : یەكێك لە ئایات و موعجیزاتەكانی خوای گەورە ئەوەیە كە لەنەفسی خۆتان خێزانـی بـۆ بەدی هێناون بۆ ئەوەی ببێتە جێی سوكنایی و ئارامگرتن و حەوانەوە لەپاڵیاندا و لە نێوانیـشتاندا خۆشەویـستی و وەفا و ڕەحمەتی بەدی هێناوە ئەمەش وەكو ئایاتێك و موعجیزاتێك بۆ كەسانێك كە تێدەفكرێن .

هەر لەو كاتەوە تاكو ئێستا بەتێپەڕبوونی كات ئەو كارە هەر بەردەوامە و دەبێت هەر بەردەوامیش بێت .

یەكێك لەشاعیرە تێنەگەیشتووەكانی عـەرەب لـە دێـڕە شـیعرێكدا بـەم شـێوەیە وەسـفی ئافرەتمـان بـۆ دەكات و دەڵێت :

إن النساء شياطين خلقن لنا　　　　نعوذ بالله من شر الشياطين

واتە : ئافرەتان شەیتانن بۆمان دروستكراون ، پەنا دەگرم بەخودا لە خراپەی شەیتانەكان .

دواتر ئافرەتێكی زانا وخاوەن بیرێكی فراوان وەڵامێكی زۆر كورت و پوختی دەداتەوەو دەڵێت :

---

[3] ( سورة النساء : ١ ) .

[4] ( سورة الروم : ٢١ ) .

إن النساء رياحين خلقن لكم          وكلكم يشتهي شم الرياحين

واته : ئافرەتان رەیحانەن بۆ ئێوە بەدی هێنراون ، وە هەمووتان حەز لە بۆنكردنی رەیحانە دەكەن .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( أربع من السعادة ، المرأة الصالحة ... ) [5] ، واته : چوار شت هەن دەبنـە هۆی خۆشبەختی بۆ مرۆڤەكان یەكێك لەوانە ژنێكی ساڵحە و چاكە .

لەبەرامبەریشدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( أربع من الشقاء ، المرأة السوء ... ) [6] ، واته : چوار شتی دیكە هەن دەبنە هۆی بێزاری ناخۆشی بۆ مرۆڤەكان یەكێك لەوانە ژنێكی خراپە .

لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرموێت : ( إنما الدنيا متاع وليس من متاع الدنيا شيء أفضل من المرأة الصالحة ) [7] ، واته : بەڕاستی دونیـا خـۆش و دڵڕفێنـە وە لـە خۆشـییەكانی دونیـا شـتێك نیـە چاكتربێت لە ئافرەتێكی ساڵحە .

---

[5] ( صححه العلامة الألباني في : صحيح الجامع برقم : ٨٨٧ ).

[6] ( هەمان فەرموودە ) .

[7] ( صححه العلامة الشخ الألباني في : صحيح سنن ابن ماجه ، برقم : ١٨٥٥ ) .

## سوودەكانی ژن هێنـان

١ . یەكێك لەو سودانەی كە لەژنهێناندا هەیە جێبەجێكردنی فەرمانی خوای گەورەیە وەكو لـەم ئایەتـە پیرۆزەدا دەفەرموێت : ﴿ وَأَنْكِحُوا الأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْـــنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ ﴾ [٨] .واتـە : ئەوانـەی كـە بـێ ژن و بـێ پیـاون ژنیـان بـۆ بهێـنن و بەشـوویان بـدەن لەبەنـدە چاكەكانتان ، وە مەترسی هەژاریتان نەبێت چونكە ئەگەر هەژاریش بن خوای گەورە بە فەزڵ و چاكەی خۆی دەوڵەمەندتان دەكات .

٢ . سوودێكی تر كـە پێویـستە بخرێتـە ڕوو ئەوەیـە كـە ژنهێنـان خـوای گـەورە داینـاوە و هـەر ئـەویش منـەتمان بەسـەردا دەكـات بـۆ ئـەوەی ژن و پیـاو لەتەنیـشت یەكتریـدا بخـۆن و بخۆنـەوە و بحەسـێنەوە و ئارامبگرن ، وەكو لەم ئایەتەدا دەفەرموێت : ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَـــسْكُنُوا إِلَيْهَـــا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَـــوْمٍ يَتَفَكَّـــرُونَ ﴾ [٩] .واتـە : یـەكێك لەنیـشانەكانی توانـا و دەسەڵاتی خوای گەورە ئەوەیە كە لەخۆتان ( لە ئـادەم ) خێزانـی بـۆ دروسـتكردوون كـە ( حـەوا) یـە ، بـۆ ئەوەی لای ئەو جێنشین بن و بحەوێنەوە وەسۆز و خۆشەویستی و بەزەی خستۆتە نێوانتانـەوە ئـەم پەنـدو بیرخستنەوانە بۆ كەسانێكە كە تێبفكرێن .

٣ . خوای گەورە ئافرەتی چواندووە بە پۆشاكی پیاو ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە ئافرەت دەبێت هـۆی ستركردن و شاردنەوەی عەیب و ئارەزووەكانی پیاوان وە بە پێـچەوانەشەوە ، وەكـو دەفـەرموێت : ﴿ هُـــنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ ﴾ [١٠] .واتە : ئەوان پۆشاكن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاكن بۆ ئەوان .

٤ . ژن هێنان سوننەتی پێغەمبەرانە وەكو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ [١١] .واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لـەپێش تـۆدا چـەندەها پێغەمبـەرمان نـاردووە بـۆ لای نەتەوەكانیان وە خێزان و منداڵمان پێ بەخشیون .

٥. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێكردووین بەژن هێنان وەكـو دەفـەرموێت : ( يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة ، فليتزوج ؛ فإنه أغض للبصر ، وأحصن للفرج ، ومن لم يستطع فعليه بالصوم ؛ فإنه لـــه وجاء ) [١٢] .واتە : ئەی كۆمەڵی لاوان كێ لەئێوە توانـای هەیـە ـ توانـای جەسـتەیی و مـادی ـ بـا ژن بهێنێت

---

[8] ( سورة النور : ٣٢ ) .
[9] ( سورة الروم : ٢١ ) .
[10] ( سورة البقرة : ١٨٧ ) .
[11] ( سورة الرعد :٣٨ ) .
[12] ( متفق عليه ) .

چونکە ژن هێنان چاو و دامێن دەپارێزێت لە حەرام ، هەر کەسێکیش توانای نەبوو ئەوا با بەڕۆژوو بێت چونکە ڕۆژوو قەڵغان و سەرشکێنی ئارەزووەکانە و لە تاوان دەیپارێزێت .

٦ . سودێکی دیکە لە سودەکان ئەوەیە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی باشترین خۆشییەکانی دونیا ، چونکە لەفەرمودەیەکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( الدنيا كلها متاع ، وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة ) [١٣] .واتە : دونیا هەمووی خۆشییە و باشترین خۆشی دونیاش ئافرەتێکی چاك و ساڵحەیە .

٧ . ژن هێنان نیوەی دینە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانمان پێدەکات بەژنهێنان ، چونکە کەسێك ژنی هێنابێت ئەوا نیوەی ئیمانەکەی تەواو بووە ، وەکو دەفەرموێت : ( من رزقه الله امرأة صالحة فقد أعانه على شطر دينه فليتق الله في الشطر الباقي ) [١٤] .

واتە : هەرکەسێك خوای گەورە ئافرەتێکی چاکی ( ساڵحە ) ی پیێ ببەخشێت ئەوا یارمەتی داوە لەسەر نیوەی دینەکەی ، دەبا تەقوای خوا بکات بۆ بەدەست هێنانی نیوەکەی تری .

وە لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( إذا تزوج العبد فقد استكمل نصف الدين فليتق الله في النصف الباقي ) [١٥]

واتە : ئەگەر مرۆڤ ژن بهێنێت ئەوا نیوەی دینەکەی تەواو کردووە ، با تەقوای خوا بکات بۆ بەدەست هێنانی نیوەکەی تری .

٨ . یەکێکی تر لەسوودەکانی ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆیەوە بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر بکات ، وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( من يضمن لي ما بين لحييه وما بين رجليه أضمن له الجنة ) [١٦] .واتە : هەرکەسێ ئەوەی نێوان ڕیش و سمێڵی بەواتای ( دەم ) ی و ئەوەی نێوان هەردوو قاچی ( دامێن ) مسۆگەر بکات ئەوا منیش بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەکەم . چونکە بەهۆی ژنهێنانەوە مرۆڤ لەتاوانی زینا و دامێن پیسی دوور دەکەوێتەوە چ ژن بێت یاخود پیاو ، هەرچەندە فەرمودەکە بەشێوەیەکی ڕەها هاتووە بۆیە ئەوەش دەگرێتەوە کە کوڕ یاخود کچ ژنبهێنێت یاخود شوبکات زیاتر توانا و دەسەڵاتی بەسەر ئەوەدا هەیە خۆی لەتاوانی زینا و داوێن پیسی بەدوور بگرێت .

٩ . یەکێك لەسودەکانی ژن هێنان ئەوەیە دەبێتە هۆکارێك بۆ یارمەتیدان و پشتگیری کردنی خوای گەورە ، هەروەکو لە فەرموودەدا هاتووە : ( ثلاثة حق على الله تعالى عونهم : المجاهد في سبيل الله،و المكاتب الذي يريد الأداء،و الناكح الذي يريد العفاف ) [١٧]

---

13 ( صححه العلامة الألباني في : صحيح الجامع ، برقم : ٣٤١٣ ) .

14 ( حسنه العلامة الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ، برقم : ١٩١٦ ) .

15 ( سەرچاوەی پێشوو ) .

16 ( رواه البخاري ) .

17 ( حسنه العلامة الألباني في : صحيح الجامع ، برقم : ٣٠٥٠ ) .

واتە : سێ كەس هەن خوای گەورە بەحەقی داناوە لەسەر خۆی كە یارمەتییان بدات ، كەسێك لەپێناوی خوای گەورەدا جیهاد بكات و كۆیلەیەك دەیەوێت خۆی بكڕێتەوە و خۆی ئازاد بكات و ئەو كەسەی دەیەوێت ژن بهێنێت و مەبەستی داوێن پاكییە .

١٠ . ژن هێنان هۆكارە بۆ زیادبوونی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) وەكو لەم فەرموودەیەدا هاتووە : ( تزوجوا الودود الولود ، فإني مكاثر بكم الأمم ) [١٨] .واتە : ئافرەتێكی خۆشەویستی منداڵ بوو بهێنن چونكە من لەڕۆژی قیامەتدا شانازی بەزۆریتانەوە دەكەم بەسەر ئوممەتەكانی تر .

١١ . ژن هێنان دەبێتە هۆی پاراستنی نەفس لە تاوانكاری و فیتنەكانی سەردەم وەكو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ما تركت بعدي فتنة أضر على الرجال من النساء ) [١٩] .

واتە : لەپاش خۆم هیچ فیتنەیەكم بەجێ نەهێشتووە بەزیان تر بێت لەسەر پیاوان لە ئافرەت .

١٢ . ژن هێنان ئەجر و پاداشتی هەیە وەكو چۆن لەكار و كردەوە چاكەكاندا پاداشت وەردەگرین ، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( ... وفي بضع أحدكم صدقة . قالوا أيأتي أحدنا شهوته ويكون له فيها أجر قال أرأيتم لو وضعها في حرام أكان عليه فيها وزر فكذلك إذا وضعها في الحلال كان له أجر ) [٢٠] .

واتە : لەچوونە لای خێزانەكانتان خێر و پاداشتان بۆ دەنوسرێت ، هاوەڵان فەرموویان : ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) ئایا كەسێك لەئێمە ئارەزووی خۆی تێر دەكات و پاداشتی دەست دەكەوێت ؟! ئەویش فەرمووی : ئایا لەحەرامدا بەكاری بهێنێت تاوانبار نابێت ، بەهەمان شێوەش ئەگەر لەحەڵاڵدا بەكاری بهێنێت پاداشتی دەست دەكەوێت .

١٣ . ژن هێنان هۆكارێكە بۆ منداڵبوون كە لەپاش مردنی دایك و باوك ئەو منداڵانە ئەگەر چاك و خواپەرستێكی باش بن ئەوا دەبنە خێر و خۆشی بۆ دایك و باوكیان و بەردەوام كردەوەی چاكیان بۆ دایك و باوكیان دەڕوات بەبێ ئەوەی لە كردەوەی چاكی خۆیان كەم بكاتەوە .

وەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( إذا مات الإنسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة أشياء من صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له ) [٢١] .واتە : ئەگەر مرۆڤێك بمرێت ئەوا كردەوەكانی دەپچڕێت و چیتر خێری بۆناچێت تەنها لەم سێ ڕێگایەوە نەبێت : سەدەقە و خێری نەبڕاوە ( وەكو دروستكردنی مزگەوت و شتی دیكە لەو جۆرە ) ، یاخود زانیارییەكی بڵاوكردبێتەوە كە لەپاش خۆی خەڵكی سوودی لێ ببینن ، وە منداڵێكی چاك و ساڵح كە لەپاش خۆی دوعای خێری بۆ بكات .

---

[18] ( صححه العلامة الألباني في : صحيح سنن أبي داود ، برقم : ٢٠٥٠ ) .

[19] ( متفق عليه ) .

[20] ( رواه مسلم ) .

[21] ( رواه المسلم ) .

دوعای خێری منداڵ بۆ لێخۆشـبوونی دایـك و بـاوكی ئـەوا لـە بەهەشـتدا پلـەیان بـەرز دەكاتـەوە وەكـو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( **إن الرجل لترفع درجته في الجنة فيقول أنى ( لي ) هذا فيقال باســـتغفار ولدك لك** ) [٢٢] .واتە : پیاوێك لەبەهەشتدا پلە و پایەی بەرز دەكرێتەوە ، خۆی پێی سـەیرەو دەڵێـت : ئـەی پەروەردگار ئەمە هەمووی بۆ ( من ) واتە ( سەری سورٍ دەمێنێت لەو پلانە كە بەرز دەبێتەوەو واش دەزانێت كە ئەوەندە كردەوەی چاكەی نەكردووە ) پێی دەوترێت : ئەوە بەداوای لێخۆشبوونی منداڵەكەتەوە بۆ تۆ .

---

22 ( حسنه العلامة الألباني في السلسلة الصحيحة ، برقم : ١٥٩٨ ) .

# مەرجەكانی هاوسەرگیری

لێرەدا چەند خاڵێك دەخەمە ڕوو هەندێكیان دەبنە ( مەرج ) وە هەندێكی دیكەیان پێویستە وەكو خاڵێك ڕەچاوبكرێت لەوانەیە هەندێك جار نەبێتە مەرج ئەویش بەپێی ڕێككەوتن و ئەنجام نەدانی ئەو خاڵە .

١ . دەبێت كەسێكی دیندار بخوازیت واتە ئەو كەسەی كە دەتەوێت بەهاوسەری خۆتی هەڵبژێریت پێویستە كەسێكی دیندار بێت . وەكو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ ... ﴾ [٢٣] .

واتە : مارەیی ببڕن مەبەست لە بەرپرسیارانی ماڵەوەیە واتە ( وەلی ئەمر ) ەكان كە ئەو كوڕانەی وا ژنیان نەهێناوە یاخود ئەو كچانەی وا شوویان نەكردووە و مێردیان نیە لەو كەسانە مارەی ببڕن كەلەخۆتانن و لە كەسە چاك و باشەكانن و لەو كچ و كوڕانەی كە لەلای خۆتانن و كاردەكەن .

لێرەدا خوای گەورە ئەمر بە باوك و ئەو كەسانەی كە سەرپەرشتی ئەو كوڕ و كچانە دەكەن كەوا ژنیان نەهێناوە و شوویان نەكردووە با كەسی چاك و باشیان بۆ بدۆزنەوە و ژنیان بۆ بهێنن و كچانیش بەشوو بدەن .

هەروەها باشترین كەس لەلای خودا ئەوەیە كە لەهەموان زیاتر تەقوای خوا بكات و لەخوا بترسێت و كاری چاكە بەئەنجام بگەیەنێ بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێكدا دەفەرموێت : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ [٢٤] .واتە : ئەی خەڵكینە ئێمە دروستمان كردوون لە ( نێر و مێ ) وە كردوومانن بەچەندین گەل و نەتەوەی جیاواز بۆ ئەوەی یەكتر بناسن وە باشترینتان لەلای خوای گەورە ئەو كەسانەن كە تەقوای خوای گەورە زیاتر دەكەن وە خوای گەورە زانا و دانایە .

پێویستە ئەوەش بزانین كە كەسی باش دەبێت هاوسەری لەگەڵ چاكەكاردا پێك بهێنێت چونكە نابێ موسوڵمان كەسی بێ دین و كەسی خاوەن كار و كرداری خراپە بكات بە هاوسەری خۆی چونكە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ [٢٥] .

واتە : كەسی زیناكەر و داوێن پیس تەنها مارەیی ئافرەتی زیناكەر و هاوەڵ بڕیاردەر دەبڕێت وە ئافرەتی زیناكەر و داوێن پیس تەنها ئەو كەسانە مارەی دەبڕن كە داوێن پیس و هاوەڵ بڕیاردەرن بۆ خوای گەورە بۆیە ئەم جۆرە كەسانە حەرام و قەدەغە كراون لەسەر ئیمانداران .

---

[23] ( سورة النور : ٣٢ ) .

[24] ( سورة الحجرات : ١٣ ) .

[25] ( سورة النور : ٣ ) .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرموێت : ( تنكح المرأة لأربع لمالها ولجمالها ولحسبها ولدينها فـاظفر بذات الدين تربت يداك )[26] واتە : ئـافرەت مـارە دەكرێـت لـە بـەر چـوار شـت ( پارەكـەی و جوانییەكـەی و ناودارییەكەی و بەپێی دینەكەی بۆیە دینەكەی هەڵبژێرە دەستت بەخۆڵدا دەچێت ـ كە نیشانەی بەرەكـەت و چاكەیە لێرەدا پێغەمبەری خۆشەویست ( ﷺ) هـەموو شـتێكی ڕوونكردۆتـەوە چـونكە ئـافرەت دەبێـت تـۆ یەكەم مەرج دینەكەی بەهەند وەربگری و لەبەردینەكەی بیهێنی .

لە فەرموودەیەكی تر دا هاتووە : عن عبد الله بن عمرو بن العاص أن رسول الله (ﷺ) قـال : ( الـدنيا متاع وخير متاعها المرأه الصالحة )[27] .

واتە : لە عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی : دونیـا هـەمووی خۆشی و بەختەوەرییە وە چاكترین خۆشی دونیاش ئافرەتێكی چاكە .

بابزانین كە پێشینی ئەم ئوممەتە ( سەلەف سالّح ) چۆن ڕوانیویانەتە ئـەو كەسـەی كـە دێتـە خـوازبێنی كچەكەیان و ئەو خاڵەش كامەیە كـەوا ڕەچـاویان كـردووە لـەكاتی مـارەكردنی كـچەكانیان لـە كـوڕان لێـرەدا نمونەیەك دێنینەوە ئەویش ( سەعیدی كوڕی موسەییب) ە كە بەیەكێك لە گەورە شـوێنكەوتووان ( التابعين ) دەژمێردرێت كچێكی هەبوو لەڕووی دین و ڕەوشت و ئەدەب و زانـستی قورئـان و سـوننەتەكانی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) بێ وێنەبوو لەو دەمەدا خەلیفەی ئومەوی كە ( عەبدولمەلیكی كوڕی مەروان ) بوو هاتە خوازبێنی ئەم كچە بۆ كوڕەكەی كە ناوی ( وەلید ) بوو بەڵام ( سەعیدی كـوڕی موسـەییب ) پێـی ڕازی نـەبوو هەستا لەیەكێك لەخوێندكارەكانی خۆی كەوا دەرسی ئـایینی لا دەخوێنـد زۆر كـوڕێكی ئیمانـدار بـوو لەگـەڵ ئەوەشدا زۆر هەژار بوو ناوی ( كثير بن أبي وداعة) بوو مارەكرد و لەگەڵ ئەوەشدا ( ٥٠٠٠ ) درهەمی پێـدا بـۆ ڕۆژی دواتر ئەو كوڕە هەژارە وەكو پیشەی هەمیـشەیی بـەیانی زوو هەسـتا بـۆ ئـەوەی لـە وانـەكانی ( ئـیبن موسەییب ) دوانەكەوێ بەنیازبوو لەماڵ دەربچێ بەڵام خێزانەكەی كـە كـچی ( سـەعید ) ی مامۆسـتاتی بـوو پێی فەرموو بۆ كوێ دەڕۆی ئەویش وتی : بۆ كۆڕی ( ئیبن موسەییب ) بۆ ئەوەی فێری زانست بم .

ئەویش پێی فەرموو وەرە دانیشە و زانستەكەی ( سەعیدی كوڕی موسەییب ) ی باوكم لەمنەوە فێربـە و ئەویش لێیەوە فێربوو .

بەڕاستی پیاوچاكانی پێش ئێمە بەو شێوەیە فەزڵی ئیمانیان داوەتە سەر دەوڵەمەندی و كوڕی خەلیفە و پاشاكاندا .

[26] ( متفق عليه ) .
[27] ( رواه المسلم ) .

٢ . دەبێت ئەو ئافرەتە توانای منداڵ بوونی هەبێت ، وەکو لەم فەرمودەیـەی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) دەردەکـەوێ : ( جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال إني أصبت امرأة ذات حسب وجمال وإنها لا تلد أفأتزوجها قال لا ثم أتاه الثانية فنهاه ثم أتاه الثالثة فقال تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأمم ) [28] .

واتـە : پیاوێك هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و پێـی وت مـن ئـافرەتێکی نـاودار و شـۆخ و شـەنگم دۆزیوەتەوە بەڵام منداڵی نابێ ئایا بیهێنم پێغەمبەری خواش (ﷺ) پێی فەرموو ( نـەخێر ) دووبـارە هـات و وتی بیهێنم پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو ( نەخێر ) بـۆ سـێهەم جـار هاتـەوە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پێی فەرموو ( ئافرەتێکی خۆشەویستی منداڵ بوو بهێنن چونکە من لەڕۆژی قیامەتـدا شـانازی بەزۆریتانـەوە دەکەم بەسەر ئوممەتەکانی تر ) .

کەواتە یەکێکی تر لەمەرجەکانی ژن هێنان ئەوەیە کە پێویستە ئەو کەسەی کەوا مارەی دەکەین دەبێت توانای منداڵ بوونی هەبێت ، بێگومان لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە ( ئایا چۆن بزانین کە ئەو کەسەی کە بەنیازین مارەی بکەین منداڵی دەبێت یان نا ؟؟ ) ( الشیخ ندا أبو أحمد ) لـەکتێبی ( من تختار ؟ ) دا بەم شێوەیە وەڵامی دابووەوە کە دەڵێت ( بۆ ئـەوەی بـزانین کـە ئـەو ئافرەتـەی مـارەی دەبـڕین دەبێـت تێبینی ئەوە بکەین کە لەڕووی تەندروستی و توانای لاشەیی و کەم و کورتییەکانی بەتەواوی بـزانین ئەمـەش بەهۆی پرسیارکردن لەکەسە نزیکەکانی ئەو ئافرەتە کە مـارەی دەبـڕین یـاخود دەبێـت ئـەوەش بـزانین کـە لەوانەیە لە خێزانێکدا دەرکەوتبێت کە بەهۆی بۆماوەوە ( الوراثة ) زۆربەی ئافرەتـانی ئـەو خێزانـە منـداڵیان نابێت ) والله أعلم .

دەبێت ئەوەش بزانین کە منداڵ یەکێکە لە خۆشی و شتە جوانەکانی دونیا کە باوك و دایـك زۆر دڵخـۆش دەبـن بـەو منداڵـەیان چـونکە بڕوایـان وایـە کـە بەرهـەمی ئـەو ژنهێنانـە بەدەسـت هـاتووە و خـوای گـەورە دەفەرموێت : ﴿ الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ [29] .

واتە : سەروەت و سامان و منداڵ زینەت و جوانی و ڕەونەقی ژیانی دونیان

٣ . جوانی ئافرەت یەکێکە لەو خاڵانەی کە دەبێت ڕەچاوبکرێت لەکاتی ژن هێناندا چونکە گـەر کەسـێك مارەی ئافرەتێکی بڕی ئافرەتەکە بەو شێوەیە جوان نەبوو کە دڵی ئەو کـوڕە پێـی ئـارام بێـت ئـەوا دەبێتـە کێشە و گیروگرفت و هیچ دەمێك دڵخۆشی و خۆشبەختی بەدەست ناهێنێت ، بەڵام ئەمەش نابێتـە ( مـەرج ) بەڵکو خاڵێکە پێویستە جێبەجێ بکرێت ، وەکو لەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەردەکـەوێت : ( عن أبي هريرة قال : كنت عند النبي (ﷺ) فأتاه رجل فأخبره أنه تزوج امرأة من الأنصار فقـــال رســـول الله (ﷺ) : أنظرت إليها قال : لا قال : فاذهب فانظر إليها فإن في أعين الأنصار شيئا ) [30] .

---

[28] ( صححه العلامة الألباني في صحيح سنن أبي داود ، برقم : ١٧٨٩ ) .
[29] ( سورة الكهف : ٤٦ ) .
[30] ( رواه مسلم ) .

واتە : ئەبو هورەیرە وتی : لەلای پێغەمبەری خوا بووم (ﷺ) پیاوێك هـات بـۆلای و پێـی ڕاگەیانـد کـە ئافرەتێکی لە ئەنصارییەکان هێناوە ( خواستووە ) ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) پێی فەرموو : ئایا تەماشـات کرد ؟ وتی : نەخێر ، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو برۆ تەماشـای بکـە چـونکە لەچـاوی ئەنـصارییەکاندا شتێك هەیە .

٤ . خاڵێکی دیکە ئەوەیە کـە ئـەو ئافرەتـە بـا کەسـێکی بـێ لەچـك و کەسـێکی ڕووت نـەبێت بەڕاسـتی ئافرەتێك کـە خـاوەنی ( حجاب ) نـەبێت ئـەوا نابێـت کەسـێکی موسـوڵمانی پەیوەسـت ( ملتـــزم ) بـچێتە خـوازبێنی چـونکە بەڕاسـتی جیاوازییـەکی زۆر دروسـت دەبێـت لـەژیانی ئـەو دو کەسـە ، لەگـەڵ ئەوەشـدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی کەسێك نیوە ڕووت و بێ لەچك بێت دەفـەرموێت : ( صنفان من أهل النار لم أرهما : قوم معهم سياطٌ كأذناب البقر يضربون بها الناس ، ونساء كاسيات عاريـــات . مميـــلات . مـــائلات . رؤوسهن كأسنمة البُختِ . المائلة لا يدخلنَ الجنةَ ولا يجدنَ ريحها ، وإن ريحها لتوجدُ من سيرة كذا وكذا ) [31] .

واتە : دوو جۆرە کەس هەن من نەمبینیون و لەئاگری دۆزەخدان ئەوانیش کەسانێکن کەقامـچییان پێیـە لە کلکـی مانگـا دەچـێت و لەخـەڵکی دەدەن بـەو قامـچییە وە ئافرەتـانێکی پۆشـتەی ڕووت بـەلار و لەنجـە بەڕێگادا دەڕۆن و سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن ، قژەکانیان لەبان سەریان خڕ دەکەن وەکو بان پشتی وشتر ، ئەمانە ناچنە بەهەشـتەوە و بـۆنی بەهەشـتیش ناکـەن هەرچـەندە بـۆنی بەهەشـت لـە دووری ئەوەندە ئەوەندەوە دێت .

دواتر لەم سەردەمەی خۆماندا هەندێ شت دەبیستی لەوانە هەندێ کەس دەڵێن : حیجاب مەرج نییـە لـە خوازبێنی کردن کـەی ڕازی بـوو ئـەوجا خۆمـان دەیگـۆڕین و دەیکەینـە کەسـێکی دینـدار و خـاوەن بـاوەڕ . لەکاتێکدا کەسانێکی وا ئەو قسانە دەکەن خۆشیان هێشتا ئەوەندە کەسێکی باوەڕ بتە و خۆڕاگر نین لەسەر دینەکە ، برام هێشتا تۆ خـۆت کەسـێکی دینـدار و پەیوەسـت نیـت بەدینەکـەوە وتـنی ئـەو قـسانەش بـاجی لەسەرە و لەدواییدا بەسەرتدا دەشکێتەوە .

سەرەڕای هەموو ئەمانەکە باسمانکرد پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کـە دەیـەوێت خێـزان پێکـەوە بنێـت دەبێت بەپێی توانا ڕەچاوی بکات چـونکە بەڕاسـتی خۆشـبەختی لـەو کەسـەدایە کـە بـەپێی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام کاردەکات و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا دەبێت (ﷺ) .

[31] ( رواه مسلم ) .

## مەرجەكانی شووكردن

لێرەدا ئەو خاڵانە دەخەمە ڕوو كە پێویستە لەسەر كچی ئیماندار پەیڕەوی بكات لەكاتی شووكردنیدا :

١ . پێویستە ئەو كەسەی شووی پێدەكەی كەسێكی خاوەن بیروباوەڕێكی ئاینی پتەو و چاك بێت .

٢ . دەبێت خاوەنی ئاكار و ڕەوشتێكی جوان بێت .

٣ . پێویستە كەسێك بێت فەرمانەكانی خوای گەورە جێبەجێبكات وەكو ( ئەنجامدانی هەر پێنج فەرزەكەی نوێژ لەڕۆژێكدا و ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان ... هتد ) وە بەپێی تواناش سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخۆیدا پەیڕە و بكات .

٤ . دەبێت كەسێك بێت دوور بێت لەخواردنەوەی مەیی و شتە قەدەغەكراوەكان .

٥ . دەبێت كەسێك بێت هاوڕێیەتی كەسانی خراپ نەكات چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( المرء على دين خليله ، فلينظر أحدكم من يخالل ) [٣٢] .واتە : خەڵكی لەسەر ئاینی هاوەڵەكەیەتی دە ئێوە بڕوانن كێ دەكەنە هاوەڵی خۆتان .

[32] ( رواه أحمد والترمذي وأبو داود والبيهقي في : ( شعب الإيمان ) وقال الترمذي : هذا حديث حسن غريب . وقال النووي : إسناده صحيح ، وحسنه العلامة الألباني في : مشكاة المصابيح : ٥٠١٩ ) .

## ژنهێنان لەسوننەتدا

ژنهێنان یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەران ـ علیهم السلام ـ وە بەتایبەتی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) چونکە ئەو (١١) خێزانی هەبووە واتا لەتەمەنیدا (١١) ژنی هێناوە بە تێپەڕبوونی کات مردوون یاخود هەندێکیان دوای خۆیشی هەر لەژیاندا ماون . وە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ [33] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە لەپێش تۆدا چەندین نێردراومان ناردووە و خێزان و وەچەشمان پێبەخشیون .

وە خودای گەورە لەباسی پێغەمبەر موسادا (عليه السلام) دەفەرموێت : ﴿ قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ ﴾ [34] .

واتە : پێغەمبەر شوعەیب (عليه السلام) بە پێغەمبەر موسای (عليه السلام) فەرموو من دەمەوێت یەکێك لەم دوو کچەیەم لێت مارە بکەم .

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر موسا یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە بە ( أُولُو الْعَزْمِ ) دادەنرێ و کەچی ویستی نەبووە کە داخوازی کچەکە بکات بەڵکو باوکی کچەکە کە دەکاتە پێغەمبەر شوعەیب ئەو خۆی ئەم کارەی کردووە و پێغەمبەر موسای دەست نیشانکردووە بۆ ئەوەی کچەکەی لێ مارە بکات .

هەروەها دەگێڕنەوە : ( عن أنس بن مالك رضي الله عنه يقول : جاء ثلاثة رهط إلى بيوت أزواج النبي (ﷺ) يسألون عن عبادة النبي (ﷺ) فلما أخبروا كأنهم تقالوها فقالوا وأين نحن من النبي (ﷺ) قد غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر قال أحدهم أما أنا فإني أصلي الليل أبدا وقال آخر أنا أصوم الدهر ولا أفطر وقال آخر أنا أعتزل النساء فلا أتزوج أبدا فجاء رسول الله (ﷺ) إليهم فقال أنتم الذين قلتم كذا وكذا أما والله إني لأخشاكم لله وأتقاكم له لكني أصوم وأفطر وأصلي و أرقد وأتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني ) [35] .

واتە : لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) دەگێڕنەوە کە فەرمووی : سێ کۆمەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی ماڵی پێغەمبەری خوایان کرد و پرسیاریان لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد دەربارەی عیبادەت و پەرستشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك وەڵامیان درایەوە ئەوانیش بەشێوەیەکی کەم لەقەڵەمیاندا و تێیان ڕوانی وە وتیان ئێمە لەکوێین کەکاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە لەتاوانەکانی پێش و پاشی خۆش بووە ، بۆیە کەسێك لەوان وتی من شەوان شەو نوێژ دەکەم و نانووم کەسێکی دیکەیان وتی من بەڕۆژوو دەبم و بەهیچ شێوەیەك نایشکێنم وە یەکێکی دیکەیان وتی من واز

---

33 ( سورة الرعد : ٣٨ ) .

34 ( سورة القصص : ٢٧ ) .

35 ( متفق عليه ) .

لەئافرەت دەهێنم و هەرگیز ژن ناهێنم ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیـان گەیـشت و پێـی فـەرموون ئێـوە بوون بەو شێوەیە قسەتان دەكردو واتان دەوت ؟ سوێند بەخوا من لەئێوە زیاتر لەخودا دەترسێم و زیاتریش تەقوای دەكەم لەگەڵ ئەوەشدا من بەڕۆژوو دەبم و ڕۆژووش دەشكێنم نوێژیش دەكەم و پـشووش دەدەم وە ژنیش دەهێنم بۆیە هەركەسێك حەز لەسوننەتی من نەكات و لەسوننەت و ڕێبازی من لابدات ئەوا لەمن نیە .

وەكو لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە كاتێك ( حفـــصة ) ی كـچی عومـەر (رضي الله عنه) مێردەكـەی كـەناوی ( خنیس كوڕی حوزافە كوڕی قیس كوڕی عدی السهمی القرشی )[٣٦] دەبێت بەهۆی برینێكـەوە كـە لەجـەنگی ( ئوحود ) دا تووشی دەبێت شەهید دەبێت و گیان لەدەست دەدات ، بۆیە عومەر (رضي الله عنه) دوای ماوەیـەك حـەز بەوە ناكات كە كچەكەی پیاوی نەبێت و بەتەنهایی لەماڵەوە بژێت هەر لەبەر ئەو هۆیـە دەچـێتە لای ئیمـامی عوسمان (رضي الله عنه) پێی دەڵێت كە ( حفصة ) ت پێ دەدەم گەر نیازی ژنهێنانت هەیە ئەویش دەڵێت : پەلەم لێ مەكە بۆیە دوای چەند ڕۆژێك دێتەوە و دەڵێت یا عومەر ئێستا ناتوانم ژن بهێنم ، دوای ئەوە عومەر دەچـێتە لای ئەبو بەكرو پێی دەڵێت گەر پێت خۆشە ( حفصة ) ی كچمت لێ مارە دەكەم ، بۆیـە ئیمـامی ئـەبو بـەكر (رضي الله عنه) بێ دەنگ دەبێت ، پاش ئەمە ماوەیەكی كەمی بەسەردا تێپەڕ دەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچێتە خوازبێنی ( حفصة ) و مارەی دەكات ، ئیمامی ئەبو بەكر بە عومەر دەڵێت كاتێك پێت فەرمووم ( حفصة ) ت پێ دەدەم من هیچ ڕێگرییەكم لەوە نەبوو تەنها ئەوە نەبێت كە مـن بیـستبووم پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەیەوێت بێتە خوازبێنی وە منیش پێم خۆش نەبوو ئەو كارە نهێنیە بدركێنم .

بۆیە برا بەڕێزەكانم ئەی خوشكە ئیماندارەكانم وانەزانن كـە یـەكێك كـچی خـۆی یـاخود خوشـكی خـۆی بەخشیە كەسێك بەمەبەسـتی مـارە بـڕین ئـەوا شـتێكی خـراپ و ناشـیرینی كـردووە ، بۆیـە دەڵـێم نـەخێر و دیسانەوە نەخێر چەندە ئاساییە كە كوڕ خوازبێنی كچ دەكات ئەوەندەش ئاساییە كە برای كچ یاخود بـاوكی یاخود كەسێكی نزیكی كە سەرپەرشتی دەكات دەتوانێت بەشێوەیەكی شەرعی داوای خوازبێنی لە كوڕ بكات و وریای ئەوەش بێت كە یاساكانی ئیسلام تێنەپەڕێنێت ، چونكە پێشەوا عومەر (رضي الله عنه) كچی خۆی بەخشیوە بە هەریەكە لە عوسمان و ئەبو بەكر خوایان لێ ڕازی بێت بێ ئەوەی بڵێ دروست نییە یاخود ناخۆشە یاخود عەیبەیە ! ! یاخود هەر وشەیەكی دیكە كە ئەمڕۆ لێرە و لەوێ گوێبیستی دەبین ، وە ئەم نموونەیـە و دەیـان نموونەی دیكەش هەن سەبارەت بە هاوەڵان .

لێرەدا پێم خۆشە باسی كچێك بكـەم كـە ئازایـەتی و لەخواترسـی و گوێڕایـەڵی كردنـی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ی لا زۆربوو . پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵێكی هەبوو زۆر ناشیرین و پێـست ڕەش بـوو ، لەگـەڵ ئەوەشـدا شتێكی وای نەبوو لەماڵ و سامان ، ناوی ( جولەیبیب ) بوو ، بۆیە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پێـشنیاری كـرد كەوا ژن بهێنێت ، ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كێ هەیە شوو بەمن بكـات ( مـن بـازاڕم كـزە ) ،

---

[36] ئەم هاوەڵە یەكێكە لەو پیاوانەی كە هەر بەزوویی موسوڵمان بووە و بەشداری هەردوو كۆچەكەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) كردووە و بەشداری شـەڕی ( بەدر و ئوحود ) یشی كردووە .

پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو : لای خوای گەورە بازاڕت كز نیە . پێغەمبەر (ﷺ) بەدوای هەلێكدا دەگەڕا بۆ ئەوەی كەسێكی شیاوی بۆ بدۆزێتەوە تاكو ڕۆژێكیان پیاوێك سەردانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) كردو پێی وت : كچێكم هەیە ئێستا پیاوی نیە و ( بێوەژنە ) ئەگەر حەز دەكەی ئەوا پێشكەشتی دەكەم ( بەواتای ئەوەی تۆ بیخوازە ) ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : بەڵێ دەمەوێت . پیاوەكەش زۆر دڵخۆش بوو وتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێ ...

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەلاَم من بۆخۆم نامەوێ بەڵكو بۆ ( جولەیبیب ) دەمەوێ . پیاوەكەش وتی : جولەیبیب ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟؟!!

پیاوەكە وتی : پەلەم لێ مەكە تاكو پرسیارێك لەدایكی دەكەم بزانم چی دەڵێت ؟

كاتێك پیاوەكە گەڕایەوە ماڵەوە و بەخێزانەكەی وت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای كچەكەمانی كردووە ، ژنەكەش زۆر پێی خۆش بوو ، بەلاَم پیاوەكە پێی وت : بەلاَم بۆ خۆی نایەوێ .

ژنەكەش پێی وت : ئەی بۆ كێی دەوێ ؟

پیاوەكەش وتی : بۆ ( جولەیبیب ) !

ژنەكەش وتی : بێفەڕ لە جولەیبیب . نەخێر سوێند بە خوای گەورە من ئەو كچە بە جولەیبیب نادەم . لەكاتێكدا ئێمە كەسانێكی وەكو ( فلاَن و فلاَن و فیسار ) هاتە خوازبێنی كچەكەمان بەلاَم ڕازی نەبوین ئێستا چۆن بە جولەیبیبی بدەین ؟!

پاشان پیاوەكە زۆر بێتاقەت بوو بەو قسەیە و هەستا بۆ ئەوەی بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لەو كاتەدا كچەكە لەماڵەوە هاواری كرد و بەباوك و دایكی وت : كێ داوای منی كردووە ؟ ئەوانیش وتیان : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلاَم بۆ كەسێكی تر .

كچەكەش ئەوەندە ئیمانی بەهێز بوو وتی : ئایا ئێوە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەت دەكەنەوە ؟؟! ئێوە من بنێرن بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو من بەزایە نادات و من نافەوتێنێت . دواتر باوكی كچەكە چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) خۆت باشتری لێ دەزانی ، بیدە بە ( جولەیبیب ) .

لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو كچەی لە ( جولەیبیب ) مارەكردو دواتر دوعای بۆ كردن و فەرمووی : ئەی خودایە خەیر بڕژێنە بەسەریاندا ... ئەی خودایە ژیانیان ناخۆش مەكە ... پاش چەند ڕۆژێك جولەیبیب چوو بۆ غەزایەك لەگەڵ پێغەمبەری خواو هاوەڵانی ... بەلاَم كاتێك شەڕ كۆتایی پێهات ... هاوەڵان (رضي الله عنهم) دەگەڕان بۆ ئەوەی بزانن كێ ماوەو كێ بریندارەو كێ شەهید بووە . پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : ( هل تفقدون من أحد ؟ ) . قالوا : نعم فلانا وفلانا وفلانا . ثم قال : ( هل تفقدون من أحد ؟ ) قالوا : لا . قال : ( لكني أفقد جليبيبا ) فاطلبوه . فطلب في القتلى فوجدوه إلى جنب سبعة قتلهم ثم قتلـوه

فأتي النبي (ﷺ) فوقف عليه فقال : ( قتل سبعة ثم قتلوه هذا مني وأنا منه هذا مني وأنا منه ) ــ قالها مـــرتين أو ثلاثا ــ ثم قال بذراعيه هكذا فبسطهما . قال : فوضعه على ساعديه ليس له سرير إلا ساعدي النبي (ﷺ) قال : فحفر له ووضع في قبره ) [٣٧] .

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵانی فـەرموو ئایا کەسـتان بـزر کـردووە؟ وتیـان : ئێمـە فـلان و فلانمـان بزرکردووە . دوبارە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئایا کەستان بزرکردووە ؟ وتیان فلان و فلانمان بزرکـردووە . سێ جار پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم پرسیارەی کـرد لـە هـاوەڵان ، ئـەوانیش وەڵامیـان دەدایـەوە . پاشـان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : من ( جولەیبیبم ) بزرکردووە . بۆیە هاوەڵان هەستان و بەشوێنیدا گـەڕان بەڵام لەگۆڕەپانی جەنگدا نەیانبینییەوە . لەجێگایەکی نزیـك بینییانـەوە بـەکوژراوی کـە لەتەنیـشت حـەوت بێباوەڕەوە بوو کە هەموویان کوژرابوون . ( جولەیبیب ) هەر حەوتیانی کوشتبوو تاکو خـۆی شـەهید کـرا . پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر لاشەکەی وەستا و فەرمووی : حەوت کەسی کوشتووە و پاشـان شـەهیدکراوە . دواتر فەرمووی : ( ئەمە لەمنە منیش لەوم ئەمـە لەمنـە و منـیش لـەوم ) دوو تـا سـێ جـار ئـەم قـسەیەی فەرموو . پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەستی خۆی هەڵیگرت و فـەرمانی کـرد کـە گـۆڕێکی بۆبکـەن ... ئەنـەس (رضي الله عنه) دەفـەرموێت : ئێمـە لـەو کاتـەدا خـەریکی گـۆڕ هەڵکەنـدن بـووین ... ( جولـەیبیب ) هـیچ جێگەیەکی تری نەبوو تەنها دەستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت . واتە : ( لەباوەشی پێغەمبەر (ﷺ) دا بوو ) ، تاکو گۆڕەکەی بۆ کرا و خرایە نێو گۆڕەکەیەوە ) [٣٨] .

---

[37] ( رواه مسلم ) .

[38] بڕوانە : ( بەڕاستی شاژنە ) لە نووسینی ( د.محمد العريفى ) ، و وەرگێڕانی ( م.عبدالمجيد كفرى ) .

## باشترین مارەیی کەمترینیانە

لێرەدا دەمەوێ ڕوو بکەمە ئەو خوشکە موسوڵمانانە کە بەڕاستی هێدی هێدی ساڵ بەساڵ دەیانەوێ لەڕێڕەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە کارەکانی هاوەڵان و شوێنکەوتووان لابدەن و شوێن پێی کەسانێك هەڵبگرن کە ئەسڵەن نە خوا و نە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناناسن گەر بیشیانناسن بەقسەیان ناکەن ئەویش ئەوەیە کە لەم سەردەمەدا لێرە و لەوێ دەبیستیت و دەبینیت کە بە ئەوەندە ئەوەندە کیلۆ ( ئاڵتون ) کچێك مارە براوە ! یاخود زیاتر لەوەی کە ئێمە ئێستا بیری لێ دەکەینەوە کێشەکە ئەوەشە کە هەر خۆیان بەدەستی خۆیان واز لە چاکەکاری دێنن و خۆیان دەخەنە نێو داوی گەورە کچییەوە و دواتر تامردن بە دەستییەوە دەناڵێنن ، وە واش دەزانن کە چاویان لەکەسێك کرد ئەوا چاکیان کردووە و لەناو خەڵکدا بەشانازی و سەربەرزییەوە دەیگێڕنەوە و بڕی مارەییەکەیان دەخەنە ڕوو ، سوێند بێ بەخوا چاکیان نەکردووە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی بڕی پارەی مارە بڕی دەفەرموێت : ( خير النكاح أيسره) [٣٩] .

واتە : باشترین مارە بڕین ئاسان و سووکەکەیەتی .

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی بەشووی بدات لەو دەمەدا پیاوێك هەستایە سەر پێ و بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا لەمنی مارە بکە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : هیچت هەیە پێی بدەی وەکو مارەیی ؟

پیاوەکە وتی : نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچم نیە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بڕۆ بۆ ماڵەوەتان بۆ شتێ بگەڕێ و بیهێنە .

پیاوەکەش چووەوە ماڵەوە و هاتەوە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچم دەست نەکەوت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئەی ئەڵقەیەکی ئاسنت دەست نەکەوت ؟

پیاوەکەش وتی : نەخێر سوێن بەخوا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ! ! !

بۆیە پیاوەکە تەنها ئیزارێکی ( جلی خوارەوە ) ی لەبەر دابوو وە ریدائی نەبوو وتی : ئەم ئیزارەی دەدەمێ وەکو مارەیی . پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ فەرموو : ئیزارەکەت ؟ ! ! !

ئەگەر ئەو بیکاتە بەری ئەوا هیچی بۆ خۆت نامێنێ ئەگەر تۆ لەبەری بکەیت ئەوا هیچی بۆ ئەو نامێنێ !

پیاوەکەش چووە لایەکەوە و دانیشت ، دوای ماوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) پیاوەکەی بینی ڕۆشت بانگی کردەوە و پێی فەرموو : چەند قورئانت لەبەرە ؟

---

[39] ( صححه العلامة الألباني في : السلسلة الصحيحة ، برقم : ١٨٤٢ ) .

پیاوەکەش وتی : ئەو سورەتە و ئەو سورەتە و هەندێکی کەمی بۆ ژمارد کە لەبەری بوو . پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : بەو هێندە سورەتەی کە تۆ لەبەرت کردووە من مارەی دەکەم لێت ! !

ئایا کەسێك هەیە لەم سەردەمەدا ئەوەندەی ئەو ئافرەتە گوێڕایەڵی بکات بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ ئایا کەسێك هەیە ئەوەندەی ئەو پیاوە هەژارو دەست کورت بێت ؟ ئایا لەم سەردەمەدا مارەبڕین هەیە کەئەندازەی پارەکەی ئەوەندە بێت کەفێرکردنی چەند سورەتێکی قورئانە ؟؟

بێگومان نەخێر چونکە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێپەڕی و هاوەڵان و شوێنکەوتووان نەمان لەم سەر زەوییەدا و کاری چاکە کەم بوویەوە و بەدڕەشتی ( زینا ) و عیشق و غەرامیات زۆریکرد خوای گەورە پەنامان بدات جا بەناوی هەرچییەکەوە بێت کە ئەمڕۆ دەیبینین .

جگە لەمەش ئێمە دەبێت لە هەموو ژیانماندا لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لانەدەین بەپێی توانا . بۆیە من پێم خۆش نیە هەر ئەوەندە باس بکەم چونکە ئەوانەی لەپێشدا خستمە ڕوو باسی پێغەمبەر بوو (ﷺ) وە ئێستاش نمونەیەکی زیندووی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) باس دەکەم کە دەگێڕنەوە ( ئوم سولەیم ئافرەتێکی جوان و ناوداری موسوڵمان بوو لەو دەمەدا ( ئەبو تەڵحە ) هاتە خوازبێنی ئوم سولەیم ، بۆیە ئوم سولەیم پێی وت ئەی( ئەبو تەڵحە ) کەسانی وەکو تۆ بەهیچ شێوەیەك ڕەتناکرێنەوە چونکە خاوەنی بەژن و باڵا و سەروەت و سامانێکی زۆری ، لەگەڵ ئەوەشدا دروست نیە من شوو بە تۆ بکەم چونکە کەسێکی بێ دین و کافریت ، گەر دەتەوێت شووت پێبکەم ئەوا شایەتمان بهێنە و ببە بەموسوڵمان ئەو کات شووت پێدەکەم وە مارەییەکەشم تەنها موسوڵمان بوونتە نەك سەروەت و سامانی دونیا ، بۆیە ( ئەبو تەڵحە) چووە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و شایەتمانی هێنا و ( ئوم سولەیم ) شووی پێکرد ) [٤٠] . ما شاء الله ئەی ( ئوم سولەیم ) سوێند بەخوا ( ثابت ) [٤١] ڕاستی فەرمووە کە هیچ کەسێك پارەی مارەییەکەی وەکو هی تۆ نیە ئەی ( ئوم سولەیم ) ، ئەوەندەی مارەییەکەی تۆ لای خوای گەورە نرخی نیە ئەگەر هەموو ماڵ و سامانی دونیاش بێت چونکە تۆ لەڕۆژی دواییدا بەرامبەر خوای گەورە مارەییەکەت دێنن ئەویش بە ئیسلام کردنی کەسێکە لە کوفر و بێباوەڕی و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای تاك و تەنها ، وە کردنی بە کەسێکی لەخوا ترس و کەسێکی یەکتاپەرست و شوێن ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتبێت ، گومانی تێدا نیە هەر تۆش براوە دەبیت چ لەدونیا بێت یاخود چ لەقیامەت .

چونکە کەسانێکی زۆر هەن لەم سەردەمەی خۆماندا تەنانەت لە ڕابردووشدا هەر هەبوون وە گومانی تێدا نیە کە لە داهاتووشدا دێن لەمارە بڕینەکەیاندا پارەیەکی خەیاڵی وەردەگرن کەچی دوای ماوەیەك دیار نامێنێت یان بەشتی دونیایی و بەشتی پڕو پوچ دەدرێت بێ ئەوەی بیرلە ژیانێکی تر بکاتەوە کە ژیانی هەتا هەتاییە ، وە بێ ئەوەی بیر لەو کەسە بکاتەوە کە شووی پێ دەکات ، چونکە کەسانی وا هەن کاتێك شوو

---

40 ( صححه العلامة الألباني في صحيح سنن النسائي ، برقم : ٣٣٤١ ) .

41 ( ثابت ) یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو داود فەرموودەکەی لێ دەگێڕێتەوە .

دەكەن تەنها یەك ئاواتیان هەیە ئەویش ئەوەیە دەیانەوێت كوڕان بەند بكەن بە پارەی مارە بڕی وادەزانن كە ئەم كارە دوژمنكارییە ، وە شتێكی دیكەش هەیە ئەویش ئەوەیە كـە ( دایـك و بـاوك ) ڕۆڵێكـی كاریگـەر دەبینن لەم كارەدا ، چونكە زۆر كات ئەوان مەرج دەخەنە سەر ئەو كەسەی كە دێتە خـوازبێنی كـچەكەیان و بەكچەكەشیان دەڵێن : نابێت بەهیچ شێوەیەك لەقسەمان دەربچیت ئەگەر نا ئەوا ڕازی نابین تۆ شوو بكـەیت ، ئەمەو دەیان هەڕەشەی كە كە كچ ئیتر ئەسڵەن هەر ناتوانێت بڵێت نەخێر .

بەڕاستی هەموو ئەم كارانە دژ بە شەرعی ئیسلامە و خوا و پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بـەم كـارە نـاڕازین و پێیان ناخۆشە ، چونكە ئەمە قسە كردنە لەكارێكدا كە تۆ مافی ئەوەت نیە دەسـتی تـێ وەربـدەیت و قـسەی تێدا بكەیت .

## دوا ووتە

ئەو باسەی كە لەپێشدا خرایە ڕوو هەمووی پەیوەست بوو بە پرۆسەی پێش ژنهێنـان ، بـەواتای ئـەوەی كە چۆن هانی كوڕان و كچانمان بـدرێت بـۆ ئـەوەی بەسـەركەوتوویی بـچنە نـاو پرۆسـەكە و بەسـەركەوتویی ئەنجامی بدەن ( إن شاء الله ) .

چونكە زۆربەی هـاوەڵان و شـوێنكەوتووانی ئـەم ئوممەتـە پێیـان شـەرم بـووە و بـەتاوانیان دانـاوە كـە بەلاوێتی و بەبێ ژنی بگەنە خزمەتی خوای گەورە .

لەوانە ( معاذ ) لەكاتی نەخۆشییەكەیدا كە بەهۆیەوە گیانی لەدەستدا زۆربەی كـات دەیفـەرموو : ژنم بـۆ بهێنن ، ژنم بۆبهێنن ، من پێم ناخۆشە بگەمە خزمەتی خوای گەورە و ژنم نەهێنابێ .

( شەدادی كوڕی ئەوس ) یەكێك بووە لە هاوەڵان كاتێك چاوەكانی لەدەستدا و نابینـا بـوو دەیفـەرموو : ژنم بۆ بهێنن چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسیەتی پێكردووم نەگەمە خزمەتی خوای گەورە بە بێ ژنی .

وە ( عبداللەی كوڕی مەسعود ) دەفەرموێت : ئەگەر لەدونیادا تەنها تەمەنم دە ڕۆژ بێت پـێم خۆشـە ژن بهێنم ، وە لەواتایەكی تردا هاتووە دەڵێت : پێم خۆش نیە تەنها شەوێك بەبێ ژن بژیم .

بۆیە برا و خوشكانی بەڕێزم زیاتر ڕۆچوونە نێو باسەكە شتی زۆرتر هەڵدەگرێ وەكـو لـەوەی ئێـستا مـن خستوومەتە بەرچاو وە بەو شێوەیەش تێمەگەن كە ژنهێنان یاخود شووكردن شتێكی لاوەكیە چونكە ( ئەبو بەكر ) (رضي الله عنه) لـەو ڕووەوە دەفـەرموێت : گوێڕایـەڵی فەرمانـەكانی خـوای گـەورە بـن لـەبارەی ژنهێنانـەوە ، چونكە بەهۆی ئەوەوە دەتوانن دەوڵەمەندی بەدەست بهێنن .

واتە ئەی گەنجان ژنبهێنن بەهۆی ئەوەوە پەیمانەكەی خوای گەورەتان بەر دەكەوێت كە دەوڵەمەندییە .

وە ( عەلی ) (رضي الله عنه) لەو ڕووەوە دەفەرموێت : ژن بهێنن بۆ ئەوەی دەوڵەمەندی بەدەست بهێنن .

زانینی هەموو ئەم ئایات و فەرموودانە و كاری هاوەڵان وتەكانیان سەرەڕای بینین و بیـستنی دەیـان نموونـەی دیكە كە ناكرێ هەمووی باسبكرێ و هەمووی لەم نامیلكەیەدا بخرێتە ڕوو ، دەبێت ئێمە بەس بیستن نەبێت یـاخود خوێندنەوە نەبێت چونكە ( كردار ) هكـە لـە هـەمووی گـرنگترە و لەهـەمووی پێـشترە ، وە داوام لـەخوای گـەورە ئەوەیە هاوكاری هەموو كەسێكی موسوڵمان بكات بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو كارە و داواشم ئەوەیە لەكـەم و كورییـەكانمان ببورێت و ئەوەشمان خستۆتە ڕوو سود بەخش بێت بۆ هەموو لایەك ( إن شاء الله ) ... ئامین .

بەپشتیوانی خوای گەورە كۆتایی پێهات

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**هیوا محمد مجید/ شارۆچكەی كفری**

١٠ / ٠١ /٢٠١٠

## سەرچاوەکان

### سەرچاوە کوردییەکان :

١ . هاوسەرگیری . نووسینی ( پشتیوان محمد ) .

٢ . ئامۆژگاری بۆ کچانی موسوڵمان پێش هاوسەرگیری .دایکی ئالاء.

٣ . بەڕاستی شاژنە . نوسینی ( د.محمد العریفی ) ، وەرگێڕانی ( م.عبدالمجید کفری ) .

٤ . گۆڤاری ( ڕێگای ڕاست ) ژمارە ( ١٣ ) .

٥ . بڵاوکراوەی ( زانست ) ژمارە ( ٦ ) .

### سەرچاوە عەرەبییەکان :

١ . آداب الزفاف في السنة النبوية المطهرة . للعلامة المحدث ( محمد ناصرالدين الألباني ) ( رحمه الله ) .

٢ . نكاح الصالحات . عبدالملك القاسم .

٣ . تحفة العروسين . مجدي بن منصور بن سيد الشوري .

٤ . من تختار .الشيخ ندا أبو أحمد .

٥ . من تختارين . الشيخ ندا أبو أحمد .

٦ . ( هديتي لابنتي عند زفافها ) . الشيخ الدكتور محمد بن رزق بن طرهوني .

٧ . الزواج وفوائده وآثاره النافعة. عبدالله بن جار الله الجار الله .

=====================